# گۆڤاری پەرستار

ژمارە (٨)ی ئاداری ٢٠١٣

گۆڤارێکی تەندروستی و ڕۆشنبیری گشتی وەرزیە، کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان دەری دەکات



## سینگە کوژە



## دیدارێک لەگەڵ سەرۆکی کۆمەڵەی زانستی پەرستاران



## بەرە و سیستەمێکی شارستانی نوێی پەرستاری

## دیدارێک لەگەڵ ڕاگری کۆلێژی پەرستاری



## سەردانی ستافی کۆمەڵە بۆ شاری سلێمانی



## گرنگی هەبوونی ئەنجومەنێکی پەرستاری لە کوردستان

# سەروتار

دیارە گۆڤارێك بەناوی پەرستار تەكانێكە بۆ شان بەشان كردنی قەڵەم و سەرنجەكانی پەرستار بۆ بەرەو پێش بردنی ئاستی زانیاری و كرداری پەرستارانی كوردستان بە هەموو ئاستەكانیەوە، هەر بۆیە بۆ جاری دووەم و سێیەم كۆمەڵەی زانستی پەرستارانی كوردستان جارێكی تر خۆی نوێ كردەوە دوای بەستنی كۆنگرە لە (٢٠١٢/٨/٢٥) بە هیوای ئەوەی ئەم كۆمەڵەیە ببێتە مۆمی رۆشنكەرەوە و سونبولی كۆكردنەوەی هەموو پەرستاران لە دەوری خۆی بۆ داكۆكیكردنی ئەركەكانیان بە شێوەیەكی زانستی و سەردەمیانە بۆ ئاسودەكردنی باری دەروونی و جەستەیی نەخۆشەكانمان. جا بۆ ئاسانكاری كردنی بەدەستهێنانی ئامانجەكانمان داوا لە بەرپرسە تەندروستیەكان دەكەین كە پەرستاری لێهاتوو و شارەزاو بە ئەزموون لەسەر بنچینەی زانستی و لەخۆ بووردەیی دابنێن بۆ بەرێوەبردنی بەشەكانی پەرستاری لە فەرمانگە و نەخۆشخانەكان. وەهەروەها هیوای هەموو پەرستارێكە كە سەندیكایەك بە ناوی سەندیكای پەرستارانی كوردستان بە زووترین كات دابمەزرێت هاوتا وەك هەموو پەرستارانی جیهان بریاری خۆیان لە رووی كار و داكۆكی و سیستەم گۆرین لە پیناو باشتر خزمەتكردنی كەسانی ساغ و نەخۆش بە دەستی خۆیان بێت، بۆیە هیوادارین جارێكی تر لایەنە پەیوەندارە رێگرەكان لە دروستبوونی سەندیكا چاو بە بەرژەوەندی گشتی كۆمەلانی خەڵكی كوردستان بخشێننەوە و پەلە بكەن لە درووستبوونی ئەم سەندیكایە.

د. عبدالقادر حسین



# پەرستار

ژمارە (٨)




**خاوەن ئیمتیاز**
**كۆمەڵەی زانستی پەرستارانی كوردستان**

**سەرنوسەر**
**شالاو فارس أحمد ناوپردانی**

**بەڕێوەبەری نووسین**
**ڕەیان جوهر حسین**

## دەستەی نووسەران

- د.كریم فتاح غزیز
- د.عبدالقادر حسین
- سەرهەنگ قادر أبراهیم
- هیوا أحمد محمد
- هندرێن یونس نجم
- شالاو فارس أحمد
- ڕەیان جوهر حسین
- نورالدین حمدأمین علی
- بورهان علی حمە حسین

**نەخشەسازی و تایپ**
**ئەندازیار / هۆگر رحمان ڕۆوف**



ناونیشان: هەرێمی كوردستان/ هەولێر/ دووسایدی نەورۆز/ تەنیشت فەرمانگەی ئای تی

Email: harva888@gmail.com



# دیداریك لەگەڵ بەڕێز سەرۆكی كۆمەڵەی زانستی پەرستارانی كوردستان

ئا/ شالاو فارس ناوپردانی - پەرستاری زانكۆ

دكتۆر ئەم كاتەتان باش، سوپاس بۆ بەڕێزتان بۆ ڕەخساندنی ئەم دەرفەتە، بۆ ئەوەی بتوانین لە نزیكەوە ئەم دیدارە لەگەڵ بەڕێزتان ئەنجام بدەین.



د. كريم فتاح عزيز سەرۆكی كۆمەڵەی زانستی پەرستاران



پ/دکتۆر دەکرێت لە دێرێکدا خۆت بناسێنی؟
و/ من دکتۆر کریم فتاح عزیز، لە ساڵی ١٩٨١ لە کۆلێژی پەرستاری زانکۆی بەغدا بڕوانامەی بەکالۆریۆسم بەدەست هێنا وە لە ساڵی ٢٠٠٢ بڕوانامەی ماستەرم لە کۆلێژی پەرستاری زانکۆی موصڵ لە بواری پەرستاری تەندروستی کۆمەڵ بەدەستهێنا وە لە ساڵی ٢٠٠٩ بڕوانامەی دکتۆرام لە هەمان بواردا لە کۆلێژی پەرستاری زانکۆی هەولێری پزیشکی بەدەستهێنا وە بۆ ماوەیەکی زۆر لە وەزارەتی تەندروستی کارم کردووە وە لە ساڵی ١٩٩٢ وە لە پەیمانگەی تەکنیکی پزیشکی هەولێر وەکو مامۆستا کارم کردووە و بۆ ماوەیەکی زۆر سەرۆکی بەشی پەرستاری بووم لە پەیمانگەی ناوبراو. وە ئێستا مامۆستام لە کۆلێژی پەرستاری زانکۆی هەولێری پزیشکی و بەردەوامم لەسەر کارەکەم.

پ/کۆمەڵە چۆن دروست بوو؟
و/لە سەرەتاوە بیرۆکەکە لەلایەن چەند مامۆستایەکی زانکۆ و هەندێ دەرچووانی تری کۆلێژی پەرستاری سەری هەڵدا و ئەم بیرۆکەیان دامەزراند و توانیان ڕەزامەندی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەدەست بهێنن وکۆمەڵە دەست بەکاربوو.

پ/ناوی کۆمەڵەکەتان لە ئێستا چی یە؟ وە ئێستا بارەگای دەستەی باڵا لە کوێ یە؟
و/ کۆمەڵە لە ئێستادا ناوی (کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان)ە. بارەگای لە هەولێرە دەکەوێتە سەر جووت سایدی گەڕەکی نەورۆز تەنیشت ( فەرمانگەی تەکنۆلۆجیای زانیاری IT-). وە کۆمەڵە ماڵی گشت پەرستارانە بە گشت ئاستەکانەوە.

پ/پێکهاتەی کۆمەڵە لە ئێستاداچۆنە؟
و/کۆمەڵەپێکهاتووە لەسەرۆك و جێگر و ئەندامانی دەستەی باڵا و نوێنەرمان لە پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان.

پ/ئایا ئێوە لقتان لە پارێزگاکانی تری هەرێمدا هەیە؟
و/ نەخێر بەڵام کارەکانمان لە ڕێگای نوێنەرایەتی لەشارەکانی (سلیمانی، کرکوك،دهۆك، هەولێر) بەڕێوە دەچێت.

پ/پەیوەندی زانستی و کارگێڕشیتان لەگەڵ کێیە و لە چ ئاستێکدایە؟
و/ پەیوەندیمان لە ئاستێکی باشدایە لەگەڵ وەزارەتی تەندروستی و خوێندنی باڵا و ناوخۆ و پارێزگای هەولێر و گشت نەخۆشخانە و فەرمانگەکانی تر و تەواوی سەندیکا و کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی کە لەبواری تەندروستی کاردەکەن.

پ/دەتوانی بەشێوەیەکی گشتی ئامانجەکانی کۆمەڵەمان بۆ ڕوون بکەیتەوە؟
و/ ئامانجمان بەگشتی بەرەوپێشبردنی کاری پەرستارییە لە کوردستان.

پ/ئایا دوا کۆنفراسی کۆمەڵە کەی بوو؟
و/ دوا کۆنفراسی کۆمەڵە لە ٢٠١٢/٨/٢٥ لە هۆتێل (ڤان ڕۆیاڵ) ئەنجام درا. تیایدا دەستەی نوێی کۆمەڵە هەڵبژێردرا بە ئامادەبوونی زۆربەی پەرستارانی زانکۆ لە گشت پارێزگاکانی کورردستان. هەروەها نوێنەری بەڕێز پارێزگاری هەولێر و دادوەری بەڕێز ئامادەبوون. کۆنگرەکە بە سەرکەوتوویی کۆتایی هات و دەستەی نوێ دەست بەکاربوو.

پ/پەیوەندیتان لەگەڵ دەستەی پێشووی کۆمەڵە چۆن بوو؟
و/ من لێرەوە دەمەوێ زۆر سوپاسی دەستەی پێشووی کۆمەڵە بکەم کاری زۆر چاکیان ئەنجام داوە و جێ پەنجەیان دیارە لە کار و چالاکی یە زانستی و کارگێڕیەکان، ئێستاش هاوکارمانن دووبارە سوپاسیان دەکەم.

پ/چالاکیەکانی کۆمەڵە لە ئێستادا لەچیدا چڕ دەبێتەوە؟
و/ ناتوانم بە تەحدید بڵێم تەنها ئەم چالاکیانە ئەنجام دەدەین، چونکە چالاکیەکانمان پەیوەستن بە پێویستیەکانی پەرستاران و نەخۆشخانەکان و هی تریش، بەڵام دەکرێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا چالاکیەکان کورت بکەینەوە:
١. بەرەوپێشبردنی ئاستی زانستی و پراکتیکی پەرستاران.
٢. کردنەوەی خولی ڕاهێنان لە بوارە جیاجیاکاندا.
٣. وانە ووتنەوە و سیمینار و ۆرکشۆپ.
٤. دەرکردنی گۆڤاری (پەرستار) بەشێوەیەکی وەرزی.
٥. دەرکردنی نامیلکە و ڕۆژنامە و پامپلێت لە کاتی پێویستیدا بۆ هەموو پارێزگاکان.
٦. دیدار و کۆبوونەوە لەگەڵ لایەنی پەیوەندیدار.
٧. مەشق پێکردنی پەرستاران لە بوارە جیاوازەکاندا.
٨. دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ سەندیکا و کۆمەڵە و ڕێکخراوەکان لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات.

پ/ ئایا پەیوەندیتان لەگەڵ کۆلێژی پەرستاری چۆنە؟
و/ پەیوەندیمان زۆرباشە و بەسوپاسەوە بەڕێز ڕاگری کۆلێژ هاوکارمانە لە ڕاپەڕاندنی کارەکانمان لەو بابەتانەی کە پەیوەندی بە ئەوانەوە هەبێت وەك دابینکردنی مامۆستا بۆ سیمینار و ۆرکشۆپ.

لە سەرەتاوە بیرۆکەکە لەلایەن چەند مامۆستایەکی زانکو و هەندێ دەرچووانی کۆلێژی پەرستاری سەری هەڵدا





# زانکۆی هەولێری پزیشکی / کۆلێژی پەرستاری
## دەرچووانی خولی چوارەم

ئامانجمان بەگشتی بەرەوپێشبردنی کاری پەرستارییەلە کوردستان

پ/ ئایا ئامانجی ئێستا و داهاتووتان چیە کە نەهاتۆتە دی بە هیوان بێتە دی؟

و/ بەراستی ئامانجمان گەلێ زۆرە بەلاّم گرنگ کرداره وە دەکرێ ئامانجەکانمان لەم خالآنەدا کورت بکەینەوە:

أ- رێکخستنی گشت ئاستەکانی پەرستاری و جێبەجێکردنی (Job Description) و بە دۆکیومێنتکردنی کاری پەرستاری لە فایلی نەخۆش (Nursing Notes).

ب- پۆلینکردنی پەرستاران بە گوێرەی تایبەتمەندێتی و پەرەپێدانی تایبەتمەندیەکان.

ت- پێگەیاندنی پەرستاران تا ئاستی --RN (Registered Nurse) کە ئاستێکی جیهانی ستاندەرە بۆ پەرستار.

پ- پێگەیاندنی پەرستاران تا ئاستی پەرستاری کارا (Nurse Practitioner) تا ببنە خاوەن بڕوانامەی بەرز وەك پەرستارانی جیهان.

ج- جێبەجێکردنی بەرنامەی (Mentorship) لە گشت نەخۆشخانەکان بۆ ئەوەی قوتابی کە دەچێتە کۆلێژ لەلایەن کەسانی پسپۆر لە بوارە جیاجیاکان مەشقی پێبکرێت تا ساز و ئامادە بێت بۆ پێشکەشکردنی کاری پەرستاری وە ببێتە فێرکاریش بۆ قوتابیانی دوای خۆي.

وە هەروەها ئامانجی داهاتوومان ئەوەیە کە سەندیکایەکی تایبەت بە پەرستاران دابمەزرێت بۆ رێکخستنەوەی کاری پیشەیی و زانستیان و داکۆکیکردن لە مافەکانیان هەروەك لە گشت ولآتانی جیهان ئەم سەندیکایە سەربەخۆیە و کارەکانی جێ بەجێدەکات، ئەمەش بۆ باشترکردنی کاری پەرستاری لە ناو نەخۆشخانەکان و دەرەوەی نەخۆشخانەکاندا لە هەرێمی کوردستان.

پ/ هیچ پرسیارێکمان نەماوە، دوا ووتەت چیە؟

و/ دوا ووتەم هیوام وایە ئامانجەکانی کۆمەڵەکەمان بێتە دی و کاری پەرستاری پێش بخەین لە کوردستان بە هاوکاری گشت پەرستارانی بەرێز.

**لە کۆتایدا زۆر سوپاس بۆ دکتۆر کریم فتاح عزیز سەرۆکی کۆمەڵەی زانستی پەرستارانی کوردستان بۆ رەخساندنی ئەم دەرفەتە، سوپاس بۆ بۆ بەرێزتان و هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازین.**






نەخۆشخانەی ئیمێرجنسی لە ساڵی ١٩٩٨ لە شاری هەولێر بە ناوی(life support for civilian war victim) دامەزراوە لە لایەن رێکخراوێکی مرۆیی جیهانی کە ناوی ئیمێرجنسی یە،ئەم نەخۆشخانەیە لە لایەن (international staff)سەرپەرشتی دەکرا.

ئەم نەخۆشخانەیە تاکە نەخۆشخانە بوو لە نێوان هەموو نەخۆشخانەکانی هەرێم کە بە سیستەمێکی تەندروستی جیهانی و بە بەرزترین کوالیتی و بەشێوەیەکی پرۆفیشنال واتە پیشەگەری هەر لە کارگێری و دکتۆرو پەرستارەکان و کارمەندە تەندروستیەکان و کارمەندانی تریش خزمەتیان نەك تەنها بە خەڵکی شاری هەولێر و کوردستان بەڵکو لە هەموو شارە جیاجیاکانی عێراق روویان لەم نەخۆشخانەیە دەکرد بەهۆی ئەوەی کە گوێ بیست بوون بە چ جۆرێك پێشوازی لە نەخۆش دەکرێ و چۆن چارەسەری دەکرێ و چۆن رادەستی کەسوکاری دەکرێتەوە بە تەندروستیەکی باشەوە. ئەم نەخۆشخانەیە تەنها ئەو نەخۆشانەی پێشوازی دەکرد بۆ چارەسەرکردن کە بەهەر جۆرێك لە جۆرەکانی تەقەمەنی بریندار بووبن یاخود سووتابن وە هەروەها ئەو نەخۆشانەی کە کێشەیان لە بڕبڕەی پشت بۆ دروست بووبا جا بە هەر رووداوێك بێت.

ئەم شتانەی باسم کرد رەنگە زۆربەی خەڵك بزانێ بەڵام من دەمەوێ باسی ئەوەرە گرنگەکەی بابەتەکە بکەم کە جیاوازی ئەم نەخۆشخانەیە چی بوو لەگەڵ نەخۆشخانەکانی تر؟

ئەگەر باشتر بوو تا چەند وەزارەتی تەندروستی توانی سوود لەشێوەی بەڕێوەبردن و پێگەیاندنی پەرستاری پرۆفیشنال و کارمەندی لێهاتوو وەرگرێت؟

یاخود ئایا توانی ئەم سیستەمە رێك و پڕ لە خزمەتکردنە بگوازێتەوە بۆ ناو خودی وەزارەت و فەرمانگەو نەخۆشخانەکانی تری کوردستان؟

ئەم نەخۆشخانەیە لەلایەن دەستەیەك بەڕێوەدەبرا کە لە بواری کارگێری پسپۆڕبوون نە دکتۆرو نەکارمەندی تەندروستی کاروباری کارگێریان نەدەکرد چونکە وەکو بەش و پسپۆڕي، کارگێری بواری کاری ئەوان نەبوو.

لایەنی تەندروستی و چارەسەرکردن وخزمەتکردنی نەخۆش ... هتد، کە بەرپرس لەم بوارە خودي پەرستار بوو, لەلایەن پەرستارەوە کاروباری نەخۆشەکانی نەخۆشخانەکە بەڕێوە دەچوو بەجۆرێك پەرستار ئەم نەخۆشخانەیەی بەڕێوە دەبرد کە دکتۆر تەنها نەشتەرگەری دەکردو رێنمایی و تێبینی خۆی دەنوسی و ئەوەی تر هەمووی لە ئەستۆی پەرستار بوو ,بەجۆرێك هەر کەس بە ئیش و بەرپرسیارەتی خۆی دەزانی و بە ئەرکی خۆی هەڵدەسا.

بەم جۆرە وەك هەموو نەخۆشخانەیەکی وولاتە پێشکەووتووەکانی جیهان نەخۆشیان لە دەرگای سەرەکی نەخۆشخانە لە کەسوکاری وەردەگرت و دوای چەند رۆژێك لە هەمان دەرگا نەخۆشەکە بە تەندروستیەکی باش رادەستی کەسوکاری دەکراوە بەبێ ئەوەی کەسوکاری نەخۆش بێنە ناو نەخۆشخانە و بێ ئەوەی ئاگاداری هیچ کارو بارو رۆتینیاتی ئیشی ناو نەخۆشخانە بن جگە لە مۆرکردنی فۆرمی رەزامەندی بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری بۆ نەخۆشەکە ئەگەر پێویستی کردبا کە ئەم قەدەغەکردنەی هاتوو چۆی کەسوکاری نەخۆش بۆ ناو نەخۆشخانە سوودی خۆی تێدایە کە ناکرێ لێرەدا باسي بکەم چونکە لە بابەتەکە دەردەچم قسەی زیاتر هەڵدەگرێ.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم نەخۆشخانەیە وەك هەموو نەخۆشخانەیەکی وولاتانی پێشکەوتوو لە رووی سیستەم و کارگێری و خزمەتکردنی نەخۆش بەڕێوە دەچوو بەڵام لە لایەنی بیناو ئیمکانیاتی ماددی و کەلوپەل و ئامێرە پزیشکیەکان لە هەرهەموو نەخۆشخانەکانی شاری هەولێر بەشی کەمترو بێنازتر بوو.

جێی سەرسوورمانە وەزارەتی تەندروستی و تەنانەت نەخۆشخانە تایبەتیەکانیش تا ئێستانەیانتوانیوە سوود لەم جۆرە سیستەم و خزمەتکردنە وەرگرن جگە لە نەخۆشخانەی سەنتەری دڵ نەبێت کە توانی هەمان سیستەم و بەڕێوەبردن پەیڕەو بکا بۆ خزمەتکردنی نەخۆش,وە نەك هەر سوودمان لێ وەرنەگرت و کۆپي سیستەمەکەمان نەکردو بەکارمان نەهێنا لە گشت نەخۆشخانەکانی تري هەرێم، بەڵکو بە پشت گوێ خستن و پاڵپشتی نەکردن و گرنگی پێنەدان بەم نەخۆشخانەیە رۆژ لە دوای رۆژ پەکی دەخەین و ئاوای لێدێت وەك هەر نەخۆشخانەیەك لە نەخۆشخانەکانی تري لێدەکەین و لە کۆتاییدا هیوادارم و داواکارم لە سەرۆکایەتی هەرێم و حکومەتی هەرێم و وەزارەتی تەندروستی ئاورێکی جدی تر لە بواری تەندروستی و سیستەمی بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکان بدەنەوە,لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە کارێکی جدی بکرێت بۆ لە دایکبوونی پرۆژەی (job description) وجێبەجێکردنی تاکو هاوڵاتی ئێمەش بەشێوەیەکي نمونەیي خزمەت بکرێن.


تا چەند وەزارەتی تەندروستی توانی سوود لەشێوەی بەڕێوەبردن و پێگەیاندنی پەرستاری پرۆفیشنال و کارمەندی لێهاتوو وەرگرێت؟






# دیدارێك لەگەڵ بەڕێز راگری كۆلێژی پەرستاری

## ئا/ سەرهەنگ قادر- ئەندامی دەستەی باڵا

بروانامەی دكتۆرام لە هەمان بواردا بەدەستهێنا لە كۆلێژی پەرستاری زانكۆی هەولێری پزیشكی

**دكتۆرە ئەم كاتەتان باش سوپاس بۆ بەڕێزتان بۆ ڕەخساندنی ئەم دەرفەتە، بۆ ئەوەی بتوانین لە نزیكەوە ئەم دیدارە لەگەڵ بەڕێزتان ئەنجام بدەین.**

پ/ دكتۆرە دەكرێت كورتەیەك لە كاری پێشینەت باس بكەیت؟

و/ من ناوم (ڤیان عفان نەقشبەندی)ە، دەرچووی كۆلێژی پەرستاری زانكۆی بەغدام. جگە لە ئیقامە دوو ساڵ كاری پەرستاریم كردووە لە نەخۆشخانەی فێركاری سلێمانی و لەگەڵ كاركردنم لە ئامادەیی نەخۆشیاری سلێمانی وانەم وتۆتەوە و لە ساڵی ١٩٩٣ وەك مامۆستا لە پەیمانگەی تەكنیكی هەولێر لە بەشی پەرستاری كارم كردووە. لە ساڵی ٢٠٠٥ بروانامەی ماجستێرم بەدەست هێنا لە بواری پەرستاری پێگەیشتوو (Adult Nursing) , وە لە ساڵی ٢٠٠٩ بروانامەی دكتۆرام لە هەمان بواردا بەدەستهێنا لە كۆلێژی پەرستاری زانكۆی هەولێری پزیشكی، وە ساڵی ٢٠١٠ وەك راگری كۆلێژی پەرستاری لە لە كۆلێژی پەرستاری زانكۆی هەولێری پزیشكی دەست بەكاربووم تا ئێستاش بەردەوامم.

پ/ دكتۆرە مێژووی دامەزراندنی كۆلێژی پەرستاری دەگەڕێتەوە بۆ كەی؟

و/ بەڵێ دوای ئەوەی وەك مامۆستا كارم دەكرد لە پەیمانگا زۆربەی كات بەدوای چارەسەر دەگەڕاین بۆ رەوشی پەرستاری كە ئەو كات هیچ گۆڕانكاری و تازەگەری لە نەخۆشخانەو بواری پەرستاری نەبوو، بۆیە وەك چارەسەرێك بیرمان كردەوە لە پێگەیاندنی كە هەڵگری بروانامەی ئەكادیمی بەرز (بەكالۆریۆس) بێت، بۆیە بیرۆكەی دامەزراندنی كۆلێژێكی پەرستاری هاتە كایەوە، دوای ئەوەی لێژنەیەك لە راگری كۆلێژە پزیشكیەكان(پزیشكی گشتی، پزیشكی ددان، دەرمانسازی) و نوێنەری وەزارەتی تەندروستی وە بەندە یەكێك بوو لە ئەندامانی لێژنەی دامەزراندنی ئەم كۆلێژە، بۆیە ساڵی (٢٠٠٠) بڕیاردرا بە دامەزراندنی ئەم كۆلێژە وە ئامادەكاری كرا بۆ وەرگرتنی قوتابیان بۆ ساڵی (٢٠٠١)،بۆیە قوتابیان هاتنە وەرگرتن لە ساڵی خوێندنی (٢٠٠١-٢٠٠٢) وە تا ئێستا ساڵانە بەردەوامین لە وەرگرتن و دەرچوواندنی قوتابیان لەم كۆلێژە.



پ/ رەوشی کۆلێژی پەرستاری لە ئێستا و داهاتوو چۆن دەبینی؟

و/ کۆلێژی پەرستاری لە دوای دامەزراندنیەوە بەچەند قۆناغێك تێپەڕیوە تا گەیشتۆتە ئەمڕۆ, بە خۆشحالیەوە دەتوانم بڵێم ١٥ کۆلێژ لە عێراقدا هەیە چواریان لە هەرێمی کوردستانە,لەرووی زانستییەوە کۆلێژەکەمان یەکێکە لە باشترین کۆلێژەکان بە بەراورد لەگەڵ کۆلێژەکانی تر, بە بەڵگەی بەرزی ئاستی قوتابیانمان چونکە ساڵانە کەسانی پسپۆر لە دەرەوە دێن بۆ هەڵسەنگاندنی پرۆسەی خوێندن و تاقیکردنەوە لە روانگەی ئەوانەوە پێمان دەڵێن ئاستی قوتابیەکانتان لە پرۆسەی خوێندن زۆر بەرزە.

پ/ بە شێوەیەکی گشتی رەوشی پەرستاری چۆن دەبینی لە هەرێمی کوردستان؟

و/ بەداخەوە لەدوای هەوڵ و تێکۆشان بۆ کردنەوەی چوار کۆلێژ لە هەرێم وە ژمارەیەکی بەرچاو لە پەرستاری ئامادەکراو بۆ کاری پەرستاری , بەڵام تا ئێستا گۆرانکاری ئەوتۆ لە بواری پەرستاری هەستی پێنەکراوە؟! . . .بۆچی؟ بە رای ئێمە بۆچی ئەم بوارە گۆرانکاری سەردەمیانە بەخۆیەوە نابینێت. هەندێك رایان وایە کە خودی پەرستاران هۆکارن بەڵام من رام وایە راستە پەرستاران رۆڵیان هەیە بەڵام هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی سیستەمێکی تەندروستی سەردەمیانە وەك بەرنامەی وەصفی کار (Job Description) بۆ پەرستاران و پزیشکان و سەرجەم کارمەندانی‌تەندروستی وە ئەم بەرنامەیە نەخشە رێگایە بۆ هەر کارێك وە حالەتی کۆنی ئەم سیستەمە وای کردووە کە تەواوی کارەکان لەسەر بنچینەی کۆن بڕوات کە شێوەیەکی تەقلیدی وەرگرتووە. ئەمەش بۆ کاری پەرستاری خۆی لەخۆیدا کارەساتە,چونکە کاری پەرستاری کە پێناسە دەکرێت دەوترێ (زانست و هونەرە). ئینجا ئەم دوو دەستەواژەیە پێویستیان بە تازەگەری و رێکخستن هەیە.

پ/ چی بکرێت باشە بۆ بەرەوپێشبردنی پیشەی پەرستاری بە شێوەیەکی گشتی؟

و/ پێمان وایە. بە ئەکادیمیکردنی ئەم پیشەیە بە شێوازێکی سەردەمیانە و دابینکردنی تەواوی پێداویستی کارکردنی پەرستار ی لە سەرجەم نەخۆشخانە و بنکە تەندروستیەکاندا، جێ بەجێکردنی وەصفی کار بۆ پەرستاران و لایەنی تری سیستەمی تەندروستی و باشترکردنی لایەنی دارایی پەرستاران بەوەی کە هاوسەنگ بێت لەگەڵ ئەرك و کارکردنیان.

پ/ وەك کۆلێژ چیتان کردووە بۆ پێشخستن و بەسەردەمی کردنی بواری پەرستاری؟

و/بۆچوونمان وایە کە دروستکردنی پەیوەندی ئەکادیمی لەگەڵ زانکۆکانی دەرەوە یەکێکە لە خاڵە بەهێزەکان بۆ پێشخستن و بە سەردەمی کردنی ئەم بوارە، بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە کۆلێژەکومان چەندین چالاکی و خول و پەیوەندی ئەکادیمی دروستکردووە لەگەڵ زانکۆکان بۆ نمونە پەیوەندی زانستیمان هەیە لەگەڵ زانکۆی (Red Crous)ی سویدی بۆ گۆڕینەوەی قوتابیان و مامۆستایانی هەردوولا کە بەشداربن لە پرۆسەی خوێندن، بۆ ماوەی هەشت ساڵ ئەم پرۆگرامە بەردەوام دەبێت کە لە ساڵی پارەوە دەستی پێکردووە، وە لە پرۆژەکانی (British Council) توانیمان دوو پرۆژە بەدەست بهێنین کە هەردوو پرۆژەکە هاتنە بواری جێ بەجێکردنەوە، یەکێکیان پرۆژەی دامەزراندنی بەشی مامانیە لە کۆلێژ کە لەگەڵ زانکۆی (Surry)ی بەریتانی ئەنجامدرا، وە دووەمیان خوولی راهێنانی مامۆستایانی کۆلێژ بوو لە بواری تیۆری و کرداریەوە هاتۆتە بواری جێبەجێکردنەوە بە هاوکاری زانکۆی (Eadge Hilla)ی بەریتانی تیایدا دە (١٠) مامۆستا سوودمەند بوون لەم پرۆژەیە.

وە خاڵێکی تر ئێمە هەوڵمانداوە گۆرانکاریەکان لە بواری کرداریەوە ئەنجام بدەین ئەمەش بە دابینکردنی بودجەیەکی تایبەت لەلایەن سەرۆکایەتی زانکۆی هەولێری پزیشکیەوە بۆ کڕینی چەندین ئامێری پزیشکی پێویست بۆ تاقیگەکان.

وە خاڵێکی تر کۆلێژی پەرستاری ئاسانکاری تەواوی کردووە بۆ ناردنی قوتابیان و مامۆستایان بۆ دەرەوەی وڵات بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی بەرزتر لە بواری پەرستاری بۆنمونە شەش قوتابی دکتۆرامان هەیە لە دەرەوە پێنج لە وڵاتی بەریتانیا و یەکێکیش لە وڵاتی ئێران. دە قوتابی ماستەرمان هەیە لە وڵاتانی بەریتانیا و فەرەنسا و مالیزیا و هیندستان و ئوستورالیا و ئەمریکا .کە پێمان وایە سوودی زۆری دەبێت بۆ کۆلێژەکەمان لە ئایندەدا بە تایبەتی بۆ بەسەردەمی کردنی پرۆسەی خوێندن و سیستەمی تەندروستی و بواری پەرستاری. لە ئێستادا چوار لەم بەرێزانە بڕوانامەی ماستەریان بەدەستهێناوە و گەڕاونەتەوە و لە کۆلێژ کار دەکەن.

پ/ هیچ پرسیارێکمان نەماوە. دوا ووتەت چیە؟

و/ دوا ووتەم هیوام وایە ئامانجەکانی کۆمەڵەکەمان بێتە دی و کاری پەرستاری پێش بخەین لە کوردستان.

**هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی سیستەمێکی تەندروستی سەردەمیانە وەك بەرنامەی وەصفی کار**

**لە کۆتایدا زۆر سوپاس بۆ دکتۆرە ڤیان نەقشبەندی راگری کۆلێژی پەرستاری بۆ رەخساندنی ئەم دەرفەتە، سوپاس بۆ بۆ بەرێزتان و هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازین**

# گرنگی هەبوونی ئەنجو
# Council
# لە هەرێمی



## نووسینی/ سەرهەنگ قادر سورچی
## مامۆستای زانکو- ماستەر لە تەندروستی گشتی /فەرەنسا

> ئەنجومەنێکی پەرستاری لە ئێستادا هۆکارێکە بۆ چارەسەرکردنی لایەنێکی دیاریکراو لە سیستەمی تەندروستی هەرێم

بوونی ئەنجومەنێکی پەرستاری لە ئێستادا هۆکارێکە بۆ چارەسەرکردنی لایەنێکی دیاریکراو لە سیستەمی تەندروستی هەرێم, سەرەڕای نەبوونی ئەم ئەنجومەنە لە عێراق,

بەلام هەبووني لە زۆربەی وولاتاني دراوسێ و وولاتاني بياني. .هێمایەکی دروستي کاري ئەم ئەنجومەنە دەگمەنێت لە بواری بەرەوپێشبردنی سیستەمی تەندروستي وولاتەکانیان.

ئەگەر سەیرێکی بواري خزمەتگوزاری تەندروستی هەرێم بکەیت, جگە لەوەي کە بەشێکی زۆر لە خەلك لێی نارازین, بەشێکی زۆري لایەنی پەیوەندیداریش نارازین لەو سیستەمە, بە هۆی پێشکەشنکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی بە شێوەیکی پرۆفیشنال وسەردمیانە لە سەرجەم دامودەزگا تەندروستیەکان (نەخۆشخانەو بنکەی تەندروستی. . .هتد),

سەرەرای ئەوەی کە لایەنی پەیوەندیدار ئەوەندەی خەریکی لایەنی کارگێریە, لایەنی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری کەمتر دەبینرێت.





# ...ومەنێکی پەرستاری Nursing کوردستان..

دەکرێت بلێین بوونی ئەنجوومەنێکی پەرستاری پێویستیەکی هەنووکەیە بۆ باشکردن و پێدانی خزمەتگووزاری تەندروستی بە هاوولاتیان و چاکسازی کردن لە بواری تەندروستی.

* لایەنێك لەو ئەرك و بەرپرسیارێتیانەی کە دەکەوێتە سەر ئەنجوومەن:

١-پارێزگاریکردن لە نەخۆش و هاوولاتیان لە چوارچێوەی دابینکردنی پەرستاری لێهاتوو وە پێشکەشکردنی خزمەتگووزاری تەندروستی بە کوالێتی بەرز.

٢-دانانی کارنامەی کورت و درێژخایەن لە بواري پەرستاری ( بۆ نمونە: هەریمی کوردستان چەند پەرستاری پێویستە لە ئێستاو داهاتوو).

٣-هەماهەنگی بۆ بەرەوپێشبردنی ئاستی خوێندنی پەرستاری( وەکو پسپۆری وورد لە بواری پەرستاری).

٤-کردنەوەی خول و فێرکردنی بەردەوام لە بواری پەرستاری و تەندروستی.

٥-تۆمار کردنی گشت پەرستاران و دابەشکردنیان لە سەرجەم شوێنە تەندروستیەکان (نەخۆشخانەو بنکەو سەنتەر.....هتد) بە شێوازێکی پرۆفیشنال و سەردەمیانە.

٦-کومەلێك خالی تر کە تایبەتن بە خودی پەرستارو سیستەمی تەندروستی و بریاردان.

> تۆمار کردنی گشت پەرستاران و دابەشکردنیان لە سەرجەم شوێنە تەندروستیەکان

* ئەنجوومەنی پەرستاری لە چەند وولاتێك وەك نموونە :

١-ئەنجوومەنی پەرستاری ئوسترالی Nursing Council of Australia لە سالی ١٩٣١ دامەزراوە ( لە سالی ١٩٩٧ و ١٩٩٩) چاکسازی تێدا کراوە, لە سالی ٢٠٠٩ بۆتە Nursing and Midwifery Board of Australia

٢-ئەنجوومەنی پەرستاری ئەفریقیاي باشوور South African Nursing Councilلە سالی ١٩٤٤ دامەزراوە

٣-کۆمەلەی پەرستاری ئەمریکی American Nurses Association (ANA) وەکو ئەنجوومەنێك کاردەکاو لە کونغرس بە یاسا پەسەند کراوە.

٤-ئەنجوومەنی پەرستاری هیندی Indian Nursing Council لە سالی ١٩٤٧ دامەزراوە.

تێبینی: هەموو ئەنجوومەنەکان راستەوخۆ سەر بە ئەنجوومەنی وزیرانن و بە یاسا کاروئەرکەکانیان رێکخراوە.





# کەسایەتی خۆت بناسە

How you know your personality



دکتۆر عبدالقادر حسین حمد
دکتۆرا لە پەرستاری دەروونی

**فرۆید لەو بروایەدایە چوارچێوەی دروستبوونی کەسایەتی لەپێش تەمەنی چوار ساڵی دەست پێ دەکات**

## کەسایەتی خۆت بناسە

ئەو دەروونزانانەی لەکەسایەتی دەکۆڵنەوە، گرنگی دەدەن بەچالاکی یەکانی مرۆڤ . کاتێك دووکەسی یەکتر نەناس لەشوێنێك دا یەك دەگەن، یەکسەر لەدڵی خۆیاندا یەکتر هەڵدەسەنگێنن و سەنگو نرخێکی بۆ دادەنێ. ئەم هەڵسەنگاندنە رووبەکی ژیانی کۆمەڵایەتیمانە. پێناسەیەکی کەسایەتی پوخت کارێکی قورسە، بەڵام ئەوەندە هەیە کەپەیوەندی بەو هەڵس و کەوتانەوە هەیە کەلەمرۆڤێکی تری جیا ئەکاتەوە. هانس ئایسنیك ی دەروونزانی ئینگلیزی بەهۆی بیردۆزێکەوە کەسایەتی کردووە بەچوار جۆرەوە:

١. کۆمەڵایەتی جێگیر: ئەمانە روو بەخەڵك دەدەن، قسە زۆردەکەن، زوو پەیوەندی لەگەڵ خەڵك دەبەستن، چالاکن و گوێ بەهیچ نادەن، حەز بەپێشەوایی دەکەن، کاردانەوەیان بۆ دەورو بەرەکانی خۆیان هەیە.

٢. کۆمەڵایەتی ناجێگیرن: ئەمانە چالاکن و مەزاج گۆڕن، زوو هەڵدەچن و شت گەورەدەکەن، بێ ئارام و رەشبینن.

٣. دوورە پەرێزو جێگیرن: زۆر گرنگی بەدەوروبەریان نادەن، بەڵام وریان و زۆر بیردەکەنەوە، ئاشتی خوازن، بەسەر هەڵس و کەوتی خۆیاندا زاڵن. هێمنن لەخۆرا هەڵناچن، هەڵس وکەوتیان لەگەڵ خۆشەو مەزاجیان جێگیرە.

٤. دوورە پەرێزو ناجێگیرن: دوو دڵ و سەر رەق و بێ دەنگ و دوورەپەرێزن، مەزاجیان ناجێگیرە، بەڵام وریان، بەدبین و بەئاگان.

کاتل Cattel ی دەروونزانی ئەمریکی پێ ی وایە دیاریکردنی کەسایەتی پێویستی بەخشتەیەك هەیە کە ١٧١ نیشانەی کەسایەتی تێدا دیاری کرابێ و مرۆڤی پێ تاقی بکەیتەوە. مەبەست لەنیشانەی کەسایەتی ئەو جیاکاریە هەمیشەییانەیە وەك ( بەئابرووبی ، جێ بروایی) یە، کە مرۆڤی پێ جیابکرێتەوە، بۆ نمونە بۆ هەرهەڵس وکەوتێکی باش نمرەیەکی زیاتر وەردەگرێ، وە بۆ رەوشتێکی بەد نمرەیەکی کەمتر وەردەگری. لەلێکۆلەرەوەی کەسایەتیدا چەند پرسیارێك دێتەکایەوە، بۆنمونە بۆچی کەسایەتی مرۆڤەکان جیاوازن؟ بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانەو شیکردنەوەی کەسایەتی، سێ جۆر بیردۆز هاتۆتە کایەوە:
یەکەمیان ژیانی کۆمەڵایەتی و ژینگە،، بەداهێنەرو پێکهێنەری کەسایەتی دادەنێ،
دووەمیان گرنگی بەرەچەڵەك و بۆ ماوەی مرۆڤەکە دەدات.
سێیەم: گرنگ ی بەژیانی کۆمەڵایەتی و ژینگەدەداو رەچەڵەك و بۆماوەش پشتگوێ ناخات.
بیردۆزەکانی سیگمۆند فرۆید گرنگی بەژیانی کۆمەڵایەتی و ژینگە دەدات. بەپێ ی بیردۆزەکانی ئەم کەسایەتیە بەرهەمی زنجیرەیەك رووداوە کەمناڵ لەژیانی ناو خێزاندا رووبەرووی ئەبێتەوە. هەندێ جار منداڵ لە هەندێ رووداو تێ ناگا، بەهەرسکراوی بەسەریدا تێ ناپەرێ. بەڵکو لەو قۆناغەی گەشەی کەسایەتی دا توشی وەستان fixation دەبێت، کەگەورەش دەبێت ئەم وەستانە توشی جۆرەها باری دەروونی نائاسایی دەکات.
فرۆید لەو بروایەدایە (چوارچێوەی دروست بونی کەسایەتی لەپێش تەمەنی چوار ساڵی دەست پێ دەکات).
ئایسینك - سەربە کۆمەڵەی دووەمەو رەچەڵەك و بۆ ماوەی مرۆڤ بەو هۆکارانە دادەنێت کەجۆری کەسایەتی یەکەی دەست نیشان دەکەن. ئەوەی تێبینی کرد کەمرۆڤی کۆمەڵایەتی گرانتر دێتەرا وەك لەمرۆڤی دوورە پەرێز. ئەمە گەیاندیە ئەو باوەرەی بەکۆمەڵایەتی بوون ئەنجامی هاتنە



ڕایە. ویژدانی مرۆڤ هاتنە ژێربارى کاردانەوەى مرۆڤ بەرامبەر ئەو سزادان و پاداشت کردنەی لەلایەن باوانیەوە پێ ی دەگات.

دووره پەرێز زووتر دێتە را، بەمەدا وا دەردەکەوێ دووره‌پەرێز زووتر خۆی لەگەڵ کۆمەڵەکەی دا بۆ دەگونجێنرێ. ئایسنیك - دەڵێ (تاوانکارەکان کەسایەتیەکی ناجێگیرو ناکۆمەلایەتیان هەیە، زۆر کەم دێنە ژێربارەوە، بەباشی لەگەڵ کۆمەڵدا نەگونجێنراون. لەباوان و باپیرانەوە بۆ مرۆڤ ئەمینێتەوە.

دۆزینەوە تازەکانی بۆماوەزانی (Genetics ) ئەوەی دەرخستووە کە کرۆمۆسۆمی تاوانکاران کەم و کوری تێدایە. ئەم دۆزینەوە تازەیە بگرەو بەردەی زۆری لەسەرە. چونکە وادەگەیەنێ کە ژینگە هیچ رۆڵێکی نی یە لەلادانی مرۆڤ و کردنی بەتاوانکار.

بەلام لەراستی دا ناتوانرێ کەبگوترێ جۆرەکانی کەسایەتی وەك (تاوانکار، شیزۆفرینی) بۆماوەیی یەو ، ژینگە فەرامۆش بکرێ. هەرچۆن ناتوانرێ کە بگوترێ بەرزی بالای مرۆڤ بەرەچەلەکە. بەلام دەتوانرێ بگوترێ کەجیاوازی لەبەرزی بالای دوو مرۆڤ دا کەلەهەمان ژینگەدا بەخێوکرابن بەرەچەلەکە. هەروەها دەتوانرێ بگوترێ کەجیاوازی نێوان کەسایەتی دوو مرۆڤ کەلەهەمان دەوروبەردا بەخێوکرابن و هەمان تاقی کردنەوەو ڕووداویان بەسەردا هاتبێ، بەرەچەلەکەو بۆ ماوەیی یە.

دەبێ بەئاگابین لەوەی ، بلێین کەتاوانکاری زگماکەو دەرئەنجامی کەم و کوری کرۆمۆسۆمەکانە. چونکە هەرکەسێ کەم و کوری لەکرۆمۆسۆمەکانی دا هەبێت ، تاوانکار دەرناچێت. بەلام ئامادەییان هەیە بۆ ئەوەی بن بەتاوانکار، ئەگەر هاتوو ژینگە دڵ رەق و ڕێ خۆشکەر بوو بۆ تاوانکاری.

شێلدن-Sheldon گریمانەیەکی داناوە بۆ ئەوەی جۆری لەش و لار کە بۆ ماوەیی یە پەیوەندی هەیە بەکەسایەتی مرۆڤەوە.

بۆ روون کردنەوەی ئەم مەبەستەش لەش و لاری کرد بەسێ جۆرەوە:

١.ئیندۆمۆرف - Endomorph ناوشان و پشت و سمتیان پانە، بالایان کورتە چوست وچالاك و کۆمەلایەتین.

٢.میزۆمۆرف -Mesomorph : لەشیان ەرزشەوانی هەلکەوتووە، واتە ناوشان پان و سمتیان تەسکە. ئەمانە چالاك و شەرانی و قرەقرکەرن.

٣.ئێکتۆمۆرف - Ectomorph : درێژو باریك و ناوشان باریکن، ئەمانە زیرەك و دووره پەرێزن.

سێ جۆر ئەزموون بۆ تاقی کردنەوەی کەسایەتی هەیە:

یەکەم: ئەزمونی خۆیەکی Subjective test
تاقی کارەکە دەتوانێ ئەنجامی ئەزموونەکە بەچەند جۆرێ لێك بداتەوە، ئەمەش دوو ئەزموون دەگرێتەوە:

١.ئەزموونی بابەت فامی (Thematic Apperception test ) بیست دیمەنی تەماوی بە تاقی کراوەکە دەدرێ، هەریەکەیان بە چەند جۆرێك لێك دەدرێتەوە، داوای لی دەکرێ چەند چیرۆکێ لەبارەی هەریەکەیانەوە بلی. تاقیکارەکە (دەروونزان یان پزیشکی دەروونی) چیرۆکەکان شیدەکاتەوەو بەدوای ئەو بابەتانە دەگەرێ کەلە چیرۆکەکان دا دووپات دەبنەوە. بۆ ئەوەی بەلگەیەك بدەن بەدەستەوە بۆ دەرخستنی ئەو دوو دلی و زۆرانبازیەی تاقیکراوەکەی تێدا دەژی

٢.ئەزموونی پەلەمەرەکەبی - Rorschach : لەزنجیرە کارتێك پێکهاتووە، پەلەمەرەکەبی جۆراو جۆرو رەنگاو رەنگی لەسەرە. داوا لە تاقی کراوەکە دەکرێ ئەوە باس بکات کە دەیبینێ. ئەم کارتانە بەشێوەیەك رێکخراون هەموو مرۆڤێکی ساغ یەك شت لە پەلەکاندا دەبینێ. هەموو ئەنجامێکی نائاسایی بەوە لێك دەدرێتەوەکە بەشێك لە (ئەودیو هەست اللاشعور Unconsciousness ) ی کەسایەتی مرۆڤەکە دەردەخات. بەلام ئەم ئەزمونانە دەکەونە ژێر پەلاری ئەوەوە کەهەر تاقی کارەو ئەنجامەکانی بەجۆرێك لێك دەداتەوە.

دووەم: ئەزموونی بابەتی: (Objective test ): ئەم ئەزموونە بەکاغەزو قەلەم دەکرێ. کۆمەلێ پرسیارو سەرناو لە تاقی کراوەکە دەپرسرێو داوای لی دەکرێ وەلامێك لەو چەند وەلامەی بۆ هەل بژێرێ کە بۆی دانراوە، ئەنجامەکە دیارەو لە سەر لێك دانەوەی تاقیکارەکە راناوەستێ.

سێ هەم: ئەزموونی هەلوێست و تێنوارین: Attitude and tradition test
کۆمەلە سەرناوێك بۆ تاقی کراوەکە دەخوێنرێتەوەو داوای لی دەکرێ بلێ کە چۆن لەهەریەکەیان دەروانی، بۆ نموونە (هاورێ ، رامیاری، خۆی) لەوەلامەکانەوە هەلوێست و تێنوارینی تاقی کراوەکە دیاری دەکرێ. .

زۆربەی ئەو رێگایانەی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی مێشك دادەنرێ هەولی گۆرانی هەلوێستی نەخۆشەکە دەدەن. دەرکەوتووە کە ئەو نەخۆشانە زۆرجار هەلوێستی سەیریان بەرامبەر خۆیان هەیە. چارەسەرکردنیان لەسەر ئەوەبەندە تا چ ئاستێ ئەم هەلوێست و تێنوارینانەیان دەگۆردرێ. Change of behavior کەواتە بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشانە ئەوەش گرنگە کە چەند رێگەیەکمان هەبێ بۆ پێوانی ئەم هەلوێستانە.

زۆربەی ئەو رێگایانەی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی مێشك دادەنرێ هەولی گۆرانی هەلوێستی نەخۆشەکە دەدەن



# سـینگە کـوژە

# Angina pectoris

هیوا احمد محمد/ پەرستاری زانکو/ ئەندامی دەستەی باڵا

## هۆکاری سەرەکی سینگە کوژە تەسك بوونەوەی یەکێك یان زیاتری خوێنبەرەکانی ماسولکەی دڵە

### سینگە کوژە:

سینگە کوژە ئازارێکە بەهۆی دڵەوە پەیدا دەبێت، هۆکاری سەرەکي سینگە کوژە تەسك بوونەوەی یەکێك یان زیاتری خوێنبەرەکانی ماسولکەی دڵە، واتە ئەو خوێنبەرانەی کە خوێن دەدەن بە ماسولکەکانی دڵ. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێنی پێویست نەگاتە بەشێك لە ماسولکەکەی دڵ، کەوەکو هەموو بەشەکانی تری لەش پێویستي بە خوێنە بۆ کارەکەی کە ناردنی خوێنە بۆ هەموو بەشەکانی لەش.

لەوانەیە لە کاتی پشوودان خوێنی تەواو بگاتە ماسولکەکانی دڵ، بەڵام لە کاتی ماندوو بوونی زۆردا ماسولکەکانی دڵ پێویستی زیاتری بە خوێن و ئۆکسجین دەبێت، بۆ نمونە کاتێك بە خێرای دەڕۆین یان بەسەر پەیژەدا سەر دەکەوین یان لەکاتي وەرزش کردندا لێدانی دڵ زیاد دەکات، بۆ ئەوەی زیاتر خوێن و ئۆکسجین بگوازێتەوە بۆ لەش لەم کاتەش ماسولکەکانی دڵ پێویستی زیاتری بە خوێن دەبێت، ئەم خوێنەش بەتەوای ناگاتە ماسولکەکان بەهۆی تەسك بوونەوەی خوێنبەرەکانەوە، ئەمەش دەبێتە هۆي سینگ ئێشە یان نەخوشی سینگە کوژە.






Insufficient blood flow to the heart muscle from narrowing of coronary artery may cause chest pain

ADAM

زۆربەی ئەو نەخوشانەی کە توشی سینگە گوژە دەبن زیاتر هەست بە نارەحەتی دەکەن لە سینگیان وەك لەوەی هەست بە ئازار بکەن، نیشانەکانی بریتین لە هست کردن بە پەستان لە سینگ، قورسبونی سینگ,توندبووني سینگ,هەست کردن بە دڵ گوشین, سوتانەوەي دڵ، هەستکردن بە خنکان، ئازار لە بەشی سەرەوەی ناوەراستی سك، پشت ئێشە، شان وملِ ئێشە، شەویلاگ ئیشە، وە هەندێك جار ئازارەکە لەسینگەوە دەگوازرێتەوە بۆ قۆڵی چەپ وە عادەتەن ئازاری سینگە کوژە بەهۆی ماندوو بوون، سەرما بوون، یان پاش نان خواردن یان قەڵەوی زیاد دەکات وە ماوەی ئازارەکەش زۆر کەمە. هەندێك جار نەخۆشەکە هەست بە هەناسە برکێ و تەنگە نەفەسی دەکات، هەروەها ئارەق کردن و هێلنج هاتن، لەم حالەتەدا لێدانی دڵ و پەستانی خوێن زیاد دەبێت.

هۆکارە سەرەکیەکاني سینگە کوژە بریتین لە تەمەن، جگەرە کێشان، نەخوشی شەکرە، پەستاني خوێن، بۆماوەی، بەرزی چەوری خوێن، هەندێك نەخوشي گورچیلە، قەڵەوی زۆر، وەرزش نەکردن، قەلەقی و خەمۆکی وە لە رەگەزي نێر زیاترە بەرامبەر بە مێ.

وا پێویستە هەر کەسێك هەستی بەم نیشانانەی سەرەوە کرد بە زوی سەردانی پزیشکی پسپۆري دڵ بکات بۆ ئەوەی زوو دەست نیشانی نەخۆشیەکە بکرێت چارەسەري بۆ بکرێت، تاوەکو زوو تر نەخوشیەکە دەستنیشان بکرێت چارەسەری ئاسانترو مەترسیەکێني کەمتر دەبێت.

لە کۆتایدا پێویستەهەندێك باسی خۆ پاراستن لەم نەخۆشیە بکەین وەك دەڵێن خۆ پاراستن لە چارەسەر باشترە

بۆ خۆ پاراستن و رێگرتن لە توش بوونی ئەم نەخۆشیە پێویستە هۆکارەکانی توش بووني ئەم نەخۆشیە کەم بکرێنەوە کە ئەمانەن:

١- کەمکردنەوەي چەوریە زیان بەخشەکان لە ژەمەکاني خواردندا,چونکە زۆربوني چەوري لە خوێندا دەبێتە هۆي تەسکبونەوەي بۆریەکاني خوێن بە تایبەتي بۆریەکاني دڵ و مێشك.

٢- وازهێنان و کەمکردنەوەي جگەرە کیشان و خواردنەوە کهولیەکان, چونکە جگەرە مادەي نیکوتیني تێدایە کە هۆکارێکي سەرەکي تەسك بوونەوەي بۆریەکاني خوێنە, کهولیش ئەگەر بەرادیەکي زۆربخورێتەوە دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەم نەخۆشیە.

٣- چاودێریکردن و کونترۆلکردني پەستاني خوێن و شەکرە.

٤- گرینگیدان بە لایەني دەرووني,چونکە خەمۆکي و قەلەقي زۆرو بەردەوام هۆکارێکن بۆ توشبوون بەم نەخۆشیە کەوادەکات بۆریەکاني خوێن توشي گرژبوون ببن.

٥- دابەزانداني کێشي لەش لە ژێر رێنماي پزیشکیدا بۆ ئەوانەي کە قەڵەون .

٦- وەرزشکردن بەشێوەیەکي زانستي و لە ژێر چاودێري پزیشکیدا, لە بەر ئەوەي هەندێك جار وەرزشي قورس و لە ناکاو کە ببێتە هیلاکیەکي زۆر مەترسي خەرابي دەبێت لەسەر تەندروستي.






# BMI پێوەندیی نێوان کێش و بەرزی پیشان دەدات

کورتەی دەستەواژەی (BODY MASS INDEX)ە، واتە: «نوانەی بارستەی لەش»، کە پێوەندیی نێوان (کێش = وەزن = WEIGHT) و (بەرزی، باڵا HEIGHT) پیشان دەدات. هەرچی «کێش»ی مرۆڤ بچێتە سەرەوە (BMI) ش بەرزتر دەبێتەوە و بەو جۆرە مرۆڤ زیاتر دەکەوێتە بازنەی مەرگەی زوورەسەوە.

بەدەستهێنانی (BMI) زۆر ئاسانە، (کێش) دابەش دەکەینە سەر (بەرزی * بەرزی). بەڵام بە مەرجێ کە کێشەکە بە کیلۆگرام و بەرزییەکە بە مەتر بێت نەک بە سانتیمەتر.

ئەو ژماردنە بەگوێرەی خوارەوە دەتوانین بنووسین ئەگەر لە چەپەوە بۆ ڕاست بخوێنرێتەوە:

BMI = کێش / (بەرزی * بەرزی)

واتە:

BMI = (کێش) کگم / (بەرزی * بەرزی) م۲

**نموونە:**

ئەگەر کەسێك کێشی ۷ کیلۆگرام و باڵای ١٧٤ سانتیمەتر بێت، لە پێشدا دەبێ بزانین باڵاکەی بە مەتر دەبێتە چەند، کە ئەویش دوو بۆر (کۆما) لە ژمارەکە دەچینە دواوە، کە لێرەدا دەکاتە ١,٧٤ مەتر. (BMI)ەکەی ئاوا دەژمێرین:

$$BMI = \frac{97}{1.74 * 1.74} = 32$$

واتە (BMI)ەکەی دەبێتە (٣٢).

بەگوێرەی خشتەی خوارەوە دەزانین کە ئەو کەسە دەکەوێتە خانەی «زۆرقەڵەو obese»، کە پزیشکەکان وەکوو نەخۆشییەك چاوی لێ دەکەن و گەر مرۆڤێ بکەوێتە ئەو بازنەیەوە، هەڕەشەی ژیانی لێ دەکرێت و دەبێ بیرێ بۆ قەڵەوییەکەی بکاتەوە.

خشتەی خوارەوە کە لە ساڵی (١٩٨٥) لەلایەن «WHO»، )ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی World Health Organization) بڵاو بۆتەوە، نرخە سنوورییەکانی (BMI) پیشان دەدات:

| پۆلەکانی کیش | پیاو | ژن |
|---|---|---|
| کمی کیش | ٢٠> | ١٨,٦> |
| کیشی ئاسایی | ٢٥ - ٢٠ | ٢٣,٨ - ١٨,٦ |
| زۆری کیش | ٣٠ - ٢٥ | ٢٨,٦ - ٢٣,٨ |
| زۆر قەڵەوی | ٣٠< | ٢٨,٦< |

**ئاوارتە**

ئەم شێوازە بۆ ئەو کەسانە نابێت کە وەرزشوانن و کێشیان لە جیاتیی بەز و چەوری بە ماسوولکە چووەتە سەرەوە، هەروەها بۆ منداڵی کەمتەمەن و بۆ مرۆڤێ کە باڵای لەڕادەبەدەر بەرز بێت نابێت.

**پوختە:**

(BMI) شێوازێکە بۆ پیشاندانی پێوەندیی نێوان کێش و باڵای مرۆڤ. هەرچی (BMI) زیاتر بێت مرۆڤ زیاتر تووشی نەخۆشیی خوێنبەرەکان و نەخۆشیی دڵ دەبێت کە دەبێتە هۆی مەرگی ناوەخت. بۆیە مرۆڤ دەبێ هەوڵ بدات کە (BMI)ی لاشەی لە ئاستێکی ئاساییدا ڕاگرێت، کە ئەویش لەڕێی خۆراکی لەبار و وەرزش و جموجووڵ بەدەست دێت.





# بەرەو سیستەمێکی شارستانی نوێ

دکتۆر شکر سلیم

بەرەو سیستەمێکی شارستانی نوێ ی پەرستاری:

زۆر دەمێکە فێرکردنی پەرستاری (نەخۆشیاری) لە وولاتی عیراق و کوردستان دەستی پێکردووە. لەسەرەتادا بەشێوەیەکی زۆر سادە بو بەڵام بەرە بەرە بۆ سیستەمێکی بەهێز و ئەکادیمی هەنگاوی ناوە، تا بتوانێت شان بەشانی کاری پزیشکی خزمەتی نەخۆش بکات. گومان لەوەدا نیە کە کاری پەرستاری (نەخۆشیاری) زۆر گرنگە وەك باڵی چەپی کاری پزیشکییە کە بەشی تەندروستی بەبێ ئەو باڵە ناتوانێ کارەکانی ئەنجام بدات. ئەمرۆ لە کوردستان پێشکەوتنێکی یەکجار زۆر لە بواری پێشکەوتنی زانست دەستی پێکردوە، دەتوانم بڵێم ئەو شۆرشە لە داهاتوویەکی نزیکدا بەری رەنجی ماندووبونی پەیوەنداران دەبینرێت. کولێژی پەرستاری وەك هەموو کولیژەکانی تر هەنگاوی باش و زانستی ناووە بەرەو باشتر کردنی ئاستی زانستی دەرچوانی پەرستاری لە هەرێمی کوردستان. لەسەرەتادا هەر هەمان مەنهەج و (Curriculum) ی زانکۆی بەغدای پیادەکرد بەڵام بۆ ماوەی سێ ساڵ دەچێت مەنهەج گوراوە و (Curriculum)ی نوێ هاتووە کە ئێستا لە وڵاتانی عەرەبی پیادە دەکرێت. ئەگەر تەماشای ئەو سیستەمە بکەین ماندوو بونێکی زۆر زۆر ی تێدایە هەم بۆ قوتابی هەم بۆ مامۆستا چونکە زۆربەی هەرەزۆری وانە گرنگەکان لە قوناغی سێیەمی کۆلیژ کۆبوونەتەوە بەمەش هیلاکی و ماندووبونێکی زۆرەو بەڵام دەرئەنجامێکی خراپ وەدەست دەهێنین. بۆ نموونە لە مەنهەجی کۆن نزیکەی ١٥ کاتژمێر وانەی پراکتیکی وە ٤ کاتژمێر بۆ وانەکانی تیوری بۆ بەشی پەرستاری تەندروستی منداڵ لە هەفتەیەکدا هەبوو. بەمەش قوتابی زیاتر لەناو هۆڵەکانی نەخۆشخانە دەمایەوە مامۆستاکانیش کاتی زیاتریان هەبوو بۆ فێرکردن و نیشاندانی زیاترین کەیسی نەخۆشی بەڵا م لەو مەنهەجە نوێیە تەنها ٦ کاتژمێر پراکتز و ٣ سەعات بۆ تیوری دانراوە کە بەهیچ سشوەیەك ناتوانرێت هەموو شتەکان بە تەواوی بە قوتابیان بدرێت. ئەمە نمونەیە بۆ گشت بەشەکانی تر.

ئەم مەنهەجە باش نی یە لە کاتێکدا لە وڵاتانی پێشکەوتوو وەك (بەریتانیا) لە سەرەتای نەوەدەکانی چەرخی رابردوو ئەم مەنهەجە لابراوە ئێستا مەنهەجی پسپۆری ووردی دەستی پێکردووە هەر لەسەرەتای وەرگرتنی قوتابیان پسپۆریان دیاری دەکرێت و لەو بەشەی کە حەزی لی یە وەردەگیرێت و بۆ ماوەی ٣ ساڵ بە ووردی لەو بەشە دەخوێنێت و کە دەرچوو هەر لەو شوێنە کار دەکات و ناتوانی اختصاصی خۆی بگورێت، تەنها بە خوێندنی بەشێکی تر لە سەرەتاوە. بۆیە دەبینین کاتێ کە قوتابی لەو بەشە دەردەچێت و دەچێتە ناو نەخۆشخانە زۆر بەجوانی کارەکان رادەپەرێنێت و هیچ گرفتێك دروست ناکات و زانست و زانیاریەکی زۆر باشی لە بوارەکەی هەیە. پاشان بۆ ماوەی ١ ساڵ دێتەوە کولیژ و زیاترو زیاتر لەبارەی پسپۆریەکەی دەخوێنی. بۆ یە دەبینین کە پەرستاری (نەخۆشیاری) ئەو وولاتە زۆر بە ئاسانی لە نەخوشیەکان تێدەگەن و پاش چەند ساڵێك دەتووانن پشکنینی سەرەتایی بۆ نەخۆش بکەن و هەندێکیان دەرمان بۆ نەخۆش دەنوسێت و تەنانەت لە بەشە ووردەکانیش کار دەکەن وەك endoscopy و Ultrasound . لە پاڵ کارکردنیان وەك پەرستار ئێمە وەك هەرێمی کوردستان پێویستە ئەو مەنهەجە لاببەین و مەنهەجێکی شارستانی نوێ پیادەبکەین. بۆیە دەست پێکردن بە خوێندنی پسپۆری وورد وسودی بۆ دەرچوانمان دەبێت و لە ئەنجامدا بە باشترین زانست خزمەتی گەل و وولات دەکەن.

> لە وڵاتانی پێشکەوتوو وەك (بەریتانیا) لە سەرەتای نەوەدەکانی چەرخی رابردوو ئەم مەنهەجە لابراوە ئێستا مەنهەجی پسپۆری ووردی دەستی پێکردووە





# پە رستاری کرداری (ممارس) کي يە ؟

# Who is a nurse practioner?

دکتۆر کریم فتاح عزیز/ دکتۆرا لە پەرستاری تەندروستی کۆمەڵ

ئەو پەرستارەیە کە کۆلێژی پە رستاری تە واو کردووەو بە پە رستاری تۆمارکراو ئە ژمار کراوە لە دوایی دا یە کێك لە بە رنامە کانی کرداری دبلۆم ی بالا یان ماستەر ی تەواو کردووەو لە تاقیکردنەوەی کرداری دە رچووە لە هە ر یە کێك لە پسپۆریە کانی پە رستاری بروا نامە ی دەرچوونی وەر گرتووە وە لە لایەنی یاسایی و زانستی رێگە پێدراوە کە وەکو پزیشك بە سە ربە خۆیی هەندی کردار جێ بە جێ بکات وەکو پشکنینی نە خۆش و دە ست نیشان کردن و نوو سینی هە ندێك لە دە رمانە کان بە گوێرەی پێویستی نە خۆش بەتایبەتی لە بنکە تەندروستیەکان (P.H.C) .

وە پە رستاری ممارس ئە م کارانە ئە نجام ئە دات :

١- وەر گرتنی میژووی نە خۆشیە کە و پشکنین و خوێندنەوەی ئە نجامە کانی پشکنین.

٢- پێدانی هە ندێك دە رمان کە بە پێی یا سا رێك خراوە لە هە ندێك وولات.

٣- دانانی پلانی خێزانی و بایەخ دان بە ئافرەتان پێش و پاش مندال بوون.

٤- ئە نجام دانی هە ندی نە شتە ر گە ری بچووك.

٥- بە رز کردنەوەی ئاستی رۆشنبیری تە ندروستی هاو وولاتیان.

٦- بە هێز کردنی تەندروسی و پا راستن لە نە خۆشیە کان.

٧-نا ردنی نە خۆش بۆ شوێنی مە بە ست .

وە ئە و شوێنانەی کە کاری تێدا دە کات بریتێن لە نەخۆشخانە کان و رێك خراوە کان و شوێنی بە سالا چووان و بنکە تە ندروستیە کان و نە خۆشخانە کانی ئافرە تان و لە دایك بوون و مندالان هی تر وەزۆر جۆرە پسپۆریمان هە یە کە پە رستاری( ممارس) کاری تی دا دە کات وەکو پسپۆری مندالان و ئافرەتان و تە ندروستی کۆمەل و دەروونی و هی تر وە هە رچە ندە ئە م بە رنامەیە نویەبەلام لە زۆربەی وولا تانی جیهان هە یە وە بە هیوای ئەوەی کە لای خۆشمان جێ بە جێ بکرێ وە ئەمەش ئەنجام بدرێت بە هەماهەنگی نێوان وەزارەتی خوێندنی بالا و وەزارەتی تەندروستی و لایەنی تریش، بۆ دانانی ئەم بەرنامە نوێیە کە (پەرستاری کارا) تێیدا دەبێت بە دەستپێکی کاری نوێی پەرستاری کە ئێستا لە زۆربەی ولاتانی جیهان پەیرەو دەکرێت ئەمەش بۆ زیاتر خزمەتکردنی نەخۆشەکانمان لە نەخۆشخانەکاندا .

ئەو پەرستارەیە کە کۆلێژی پەرستاری تەواو کردووەو بە پە رستاری تۆمارکراو ئەژمار کراوە



پەرستاران لە کاتی کارکردن

